بسم الله الرحمن الرحيم

ناوی پەڕتووك: " فێركردنی تەوحید بۆمنداڵان "
نووسینی: " احسان برهان الدين"
نەخشەسازی ناوەوە: " نَصْــرَتْ عثمان - عبدالله خاكی"
نەخشەسازی بەرگ: "عوسمان محمد "
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم: ١٤٤١كۆچی – ٢٠١٩ میلادی
چاپكردن: كتێبخانەی گەشە

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ
أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴾

الزمر:٦٥

## پێشەكی

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ ونَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفَرُهُ، ونَعوذُ باللهِ مِنْ شُرورِ أنْفُسِنا ومِنْ سَيِّئاتِ أعْمالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ فَلا هادِيَ لَهُ. وأشْهَدُ أنْ لا الهَ إلا اللهُ وأشهَدُ أنَّ محمداً عَبدُهُ ورسُولُهُ. يا أيُّها الذينَ آمَنوا اتَّقُوا اللهَ حَقَّ تُقاتِهِ ولا تَمُوتُنَّ إلاّ وأنتُمْ مُسلِمونَ.

يا أيُّها النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ الذي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ واحِدةٍ وخَلَقَ مِنها زَوجَها وبَثَّ مِنهُما رِجَالاً كَثيرَاً ونِساءً واتَّقُوا اللهَ الذي تَساءَلُونَ بِهِ والارْحَامَ إنَّ اللهَ كانَ عليكُمْ رَقيباً.

يا أيُّها الذينَ آمنوا اتقوا اللهَ وقُولوا قَولاً سَديدَاً، يُصلِحْ لَكُمْ أعمالَكُمْ ويَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ ورسولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوزَاً عَظيماً..

أمَّا بعدُ: فإنَّ اصَدَقَ الحَديثِ كِتابُ اللهِ، وخَيرَ الهَدِي هَدْيُ محمدٍ صلى الله عليه وسلم، وشَرَّ الامُورِ مُحْدَثاتُها، وكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ،وكُلَّ ضَلالةٍ فِي النَّارِ.

# پێشەکی

ئەمەی لەم نامیلکەدا نووسراوە زنجیرە باسێکی بە سوودە، دەربارەی هەندێ مەسەلەی گرنگ لە بیروباوەڕدا، کە پێویستە منداڵان وگەورەکانیش - ئەگەر نەیزانن - فێر بکرێن پێش ئەوەی قورئان فێر بکرێن، بۆ ئەوەی ئەو منداڵە لە سەر فیترەتی ئیسلام بێت و موەحیدێکی تەواو بێت لەسەر ئیمان و بیروباوەڕی ڕاست و درووست، باسەکە بە شێوەیەکی گشتی بە شێوازی پرسیار و وەڵام ڕێکخراوە، سەرەتا سوودم لە نامیلکەیەکی شێخ (محمد بن عبد الوهاب) وەرگرتووە بە ناونیشانی: (تعليم التوحيد الصبيان) دواتریش لە چەند سەرچاوەیەکی تری تایبەت بۆ فێرکردنی بیروباوەری راست و درووست بۆ منداڵان سودمەند بوومە.

لە ڕاستیدا ئێمەی موسوڵمان پێویستیمان بۆ تەوحید لەسەرووی هەموو  پێویستییەکە، چونکە دڵەکانمان نە سوکناییان بۆ دێت و نەبەختەوەر دەبن بە پەرستنی پەروەردگاریان نەبێت.

الله تعالى هەموو پەیامبەرانی بۆ بانگەواز کردن بۆ  تەوحید ڕەوانە کردووە، وەکو خۆی فەرموویەتی:[وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ واجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ] النحل :٣٦.

بۆیە تەوحید کلیلی بانگەوازی پەیامبەرانە سەڵات و سەلامیان لەسەر بێت و، یەکەمین ڕێگەی موسوڵمانە بۆ هاتنە ناو ئیسلام و

کۆتا شتە کە موسوڵمان لەسەری لە دونیا دەردەچێت، یەکەمین واجبە و کۆتا واجبە. لە بانگەوازی پەیامبەریشدا صلى الله عليه وسلم بۆ تەوحید ئەوەمان بە ڕوونی بۆ دەردەکەوێت چۆن گرنگی بە فێرکردنی بیروباوەڕی ڕاست داوە بۆ منداڵان بە شێوازێکی ڕوون و ئاسان، بۆیە پێویستە لە سەر هەموو موسوڵمانان، دایکان و باوکان، مامۆستایان و پەروەرشیاران، کۆشش بکەن عەقیدەی ڕاست و درووست بە شێوەیەکی سووك و ئاسان بە جگەر گۆشەکان بگەیەنن، بە تایبەتی لەم ڕۆژگارەی خۆماندا کە گومان و فیتنە و هەوڵی لە خشتەبردنی موسوڵمانان لە زیاد بووندایە، بە تایبەتی مناڵانیش لە ڕێگەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و یاری ئەلیکترۆنی و فیلمە کارتۆنییەکانەوە هەوڵ دەردرت لە عەقیدەی ئیسلام دوور بخرێنەوە.

فێرکردنی عەقیدەی ڕاست و درووست بۆ مناڵان – وەکو توێژەرێکی موسڵمان دەڵێت -گرنگی زۆری هەیە لەوانە:

١- پەیڕەوی کردنە لە مەنهەجی پێغەمبەران عليهم الصلاة و السلام، ( يَا بَنِيَّ اركب معنا ولا تكن مع الكافرين ).. (ووَصَّى بِهَا إِبْرَاهِيمُ بَنِيهِ ويَعْقُوبُ يَا بَنِيَّ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى لَكُمُ الدِّينَ فَلا تَمُوتُنَّ إلاَّ وأَنتُم مُّسْلِمُونَ)..

٢- ( يا غلام إني أعلمك كلمات احفظ الله يحفظك احفظ الله تجده تجاهك ، وإذا سألت فاسأل الله ، وإذا استعنت فاستعن بالله ... ).

٣- عەقیدە سەری هەموو زانستەکانە و بنچینەی سەرەکییانە، جا ئەگەر عەقیدە ڕەگی لە دڵی مناڵاندا داکوتا، دەبێتە بناغەیەکی تۆکمە بۆی و هەموو شتەکانی تر بە دوایدا ئاسان دەبێت.

٤- هەڵەیە کەمتەرخەمی لە گەڵ منداڵان بکرێت و بوترێت ئەوان هێشتا منداڵن بۆ زانینی ئەو پرسانە چونکە ئەگەر گەورە بوون ڕەنگە نەتوانن فێریان بکەن، ابن القیم بە ڕەحمەت بێت دەفەرموێت: ( فمن أهمل تعليم ولده ما ينفعه, وتركه سدا فقد أساء غاية الإساءة, وأكثر الأولاد إنما جاء فسادهم من قبل الآباء وإهمالهم وترك تعليمهم فرائض الدين وسننه, فأضاعوهم صغارا فلم ينتفعوا بأنفسهم,ولم ينفعوا آباءهم كبارا).

٥- گرنگیدان بە پەروەردەی منداڵان پاراستنە بۆ ئوممەتی ئیسلام، چونکە منداڵان نەوەی کاریگەری دوارۆژن، پیاوێك کۆمەڵە منداڵێکی بە دەوری ئەعمەشدا بە ڕەحمەت بێت بینی پێی وت ئەو مناڵانە بۆچی لە دەورتن؟ پێی وت: وس بە! ئەوانە سبەینێ دینەکەت دەپارێزن؟

٦- زۆری ئەو بەرنامە بینراو بیستراو خوێندراوانەی بیروباوەڕی منداڵانیان کردووەتە ئامانج، وا ئەکات موسوڵمانان دەرك بەو پیلانە بکەن و لەبەرانیەردا چەمکە ڕاستەکانی بیروباوەڕیان بۆ شی بکەنەوەو بیکەنە بناغەیەکی تۆکمە بۆ دین و دونیایان.

٧- فێرکردنی عەقیدە بۆ منداڵان لە کاتی منداڵی ئاسانترە تا وەکو ئەوەی لە کاتی گەورە بوونیان فێر بکرێن، چونکە عەقیدەی ئیسلامی لە گەڵ فیترەت دەگونجێت و منداڵ بە خۆڕسك وەریدەگرێت.

٨- ئەگەر مندالان تەوحید و عەقیدە فێر نەکرێن، لە بەرانبەردا لە ڕێگە جیاجیاکانەوە پێچەوانەکەی فێر دەکرن، بۆ نموونە ساڵانە چەندین بیروباوەری دژ بە عەقیدەی ئیسلامی فێری ئەوە دەکرێن دەربارەی بابا نۆئێل و چەندین چەمکی هەڵەی تر.

لە کۆتاییدا داواکارم لە الله تعالی ئەم نامیلکە بکاتە مایەی سوود و یاد خستنەوەیەك بێت بۆ باوکان و دایکان و مامۆستایان کە گرنگی پێویست بەم باسە مەزنە بدەن، لەگەڵ تێبینی ئەوەش کە ئەوەی لەم چەند لاپەڕە کەمەدا هاتووە بە تەنها خۆی بەس نییە، بەڵکو پێویستە ئەو مامۆستای کە دەیڵێتەوە شەرحی پێویست و ئاسانکاری یارمەتیدەریان بۆ ئەنجام بدات.

وصلی وسلم وبارك علی محمد وعلی اله و صحبه و سلم تسلیما کثیرا.

إحسان برهان الدین
١٤٣٩ / ١١ / ٠٦
٢٠١٨ / ٠٧ / ١٩
سلێمانی

***

## بەشی یەکەم
## پەروەردگارت کێیە و چۆن دەیناسیتەوە؟

ئەگەر پرسیارت لێ کرا:

١- پەروەردگاری تۆ کێیە؟

لە وەڵامدا بڵێ: پەروەردگارم **الله** یە.

٢- ئەی واتای (**رب**) پەروەردگار چییە؟

لە وەڵامدا بڵێ:

**(المالك المعبود المعين)** واتە: خاوەن و پەرستراو و یارمەتیدەرە.

**الله**... خاوەنی پەروەردگارێتی وپەرەستراوێتییە بە سەر هەموو دروستکراوەکانیدا.

٣- ئەگەر پێت وترا ..بە چی پەروەردگارت دەناسیتەوە؟

لە وەڵامدا بڵێ: بە نیشانەو بە دروستکراوەکانیدا دەیناسمەوە.

لە نیشانەو ئایەتەکانی پەروەردگار: شەو و ڕۆژ و خۆر و مانگە، لە دروستکراوەکانیشی: ئاسمانەکان و زەوی و هەرچیش کە لە ناویاندایە.

بەڵگەش لەسەر ئەوە فەرموودەی **الله** یە: ﴿ **إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى**

الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴾.[١]

تەفسیری ئەم ئایەتەیان لە پێشەوا **مالیک** و **ئەحمەد** پرسیووە، لە وەڵامدا وتوویانە: وەستانەکە حەقیقەتی هەیە، چۆنیەتیەکەی شاراوەیە، پرسیار کردن دەربارەی بیدعەیە، باوەڕ بوون پێی واجبە).

٤- ئەگەر پرسیارت لێ کرا: الله بۆچی تۆی درووست کردووە؟

لە وەڵامدا بڵێ: بۆ پەرستنی خۆی بە تاك و تەنها و بێ هاوبەش دانان و گوێڕایەڵی کردنی بە ئەنجامدانی ئەوەی کە فەرمانی پێکردووەو خۆ بە دوور گرتن لەوەی قەدەغەی کردووە، وەکو خۆی فەرموویەتی: (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ)[٢] هەروەها فەرموویەتی: (إِنَّهُ مَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ)[٣] شیرك یش ئەوەیە هاوشێوەیەك بۆ **الله** دابنات و هاواری پێ بکات، تکای لێ بکات و ئومێدی پێ بێت و لێی بترسێت و پشتی پێ ببەستێت و ڕووی تێبکات بە جیا لە **الله تعالی**، یان هەر جۆرێکی تر لە عیبادەت، چونکە وشەی **(العبادة)** ناوێکی کۆکەرەوەیە بۆ هەموو گوفتار و کردارێکی شاراوەو دیار کە **الله** تعالی

[١] الاعراف:٥٤

[٢] .الذاريات:٥٦.

[٣] المائدة:٧٢

حەزی لێ دەکات و پێی رازییە، وەکو نزا کردن و پاڕانەوە، **اللە** تعالی فەرموویەتی: (وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا)[1]

بەڵگەش لەسەر ئەوەی هاوار کردن و پاڕانەوە لە غەیری **اللە** بێ باوەڕییە، فەرموودەی **اللە** خۆیەتی: (وَمَن يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِندَ رَبِّهِ ۚ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ)[2]

چونکە نزاو پاڕانەوە لە گەورەترین جۆرەکانی عیبادەتە،

وەکو پەروەردگارتان فەرموویەتی: (وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۚ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ)[3] لە فەرموودەیەکیشدا هاتووە کە ئەنەس **اللە** لێی ڕازی بێت دەیگێڕێتەوە:

(الدعاء مخ العبادة) یان لە فەرموودیەکی صحیح ی تردا هاتووە:

(الدعاء عبادة) واتە: نزاو پاڕانەوە عیبادەتە.

یەکەمین شتیش کە **اللە** تعالی لەسەر بەندەکانی فەرزی کردووە ئەوەیە نکۆڵی لە تاغوت بکەن و عیبادەتکردنی ڕەت بکەنەوە،

**اللە** تعالی فەرموویەتی: (وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ)[4]. تاغوت هەر شتێکە لە گەڵ

---

[1] الجن:١٨

[2] المؤمنون:١١٧.

[3] غافر:٦٠.

[4] النحل:٣٦.

**الله** بپەرستڕێت، یان واتای شەیتان و جادووگەر و فاڵگرەوەو ڕمڵ لێدەر و ئەو کەسەی بە غەیری قورئان حوکم بکات دەگرێتەوە.

**(ابن القيم)** رحمه **الله** فەرموویەتی: (الطاغوت: كل ما تجاوز به العبد حده من معبود أو متبوع أو مطاع ) واتە: طاغوت بریتییە لە هەموو شتێك بەندە ئەو شتە لەسنووری خۆی دەربکات، پەرستراو بێت یان شوێنکەوتوو و پەیڕەوکراو.

***

## بەشی دووەم
## ئیسلام وبنەماکانی

ئەگەر پرسیارت لێ کرا:

ئایینت چییە؟

**لە وەڵامدا بڵێ:** ئیسلام ئایینمە.

ئیسلام یش واتە: خۆ بە دەستەوەدان بۆ **الله** بە تەوحید و بە ملکەچ کردن و گوێڕایەڵیکردن و خۆشویستنی موسوڵمانان و ڕق لێبوونی موشریکان و ئەوانەی هاوبەش بۆ **الله** بڕیاردەدەن.

**الله** تعالى فەرمووەتی: (إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ)[1] هەروەها فەرموویەتی: (وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ)[2]. لە فەرموودەی صحیح یشدا لە ڕەسول **الله** هاتووە صلى **الله** عليه وسلم کە فەرمویەتی: (تشهد أن لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله ، وتقيم الصلاة ، وتؤتي الزكاة ، وتصوم رمضان ، وتحج البيت إن استطعت إليه سبيلا) واتە: شایەتمان بهێنێت ( واتە: بڵێیت أشهد ان لا إله إلا الله و أشهد ان محمدا رسول الله و

[1] آل عمران:١٩.

[2] آل عمران: ٨٥.

مافەکانیشیان بدەیت[1]) و نوێژ بە ڕێك و پێکی بکەیت و زەکاتی ماڵەکەت دەربکەیت وڕۆژووی ڕەمەزان بگریت  ئەگەر توانات هەبوو حەجی یش بکەیت.

( لا إله الا الله) واتە: هیچ پەرستراوێك (بە حەق) نییە جگە لە **الله** نەبێت، وەکو **الله** فەرموویەتی:

(وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ إِنَّنِي بَرَاءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ إِلَّا الَّذِي فَطَرَنِي فَإِنَّهُ سَيَهْدِينِ وَجَعَلَهَا كَلِمَةً بَاقِيَةً فِي عَقِبِهِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ)[2] بەڵگەش لەسەر فەرزبوونی نوێژو زەکات فەرموودەی **الله** یە لە قورئاندا: (وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ  وَذَٰلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ)[3] ئایەتەکە بە تەوحید و نکۆڵی کردن لەوانە دەستی پێکردووە کە هاوبەش بۆ **الله** دادەنێن.

مەزنترین شت **الله** فەرمانی پێ کردبێت تەوحیدە و گەورەترین شتیش قەدەغەی کردبێت و نکۆڵی لێکردبێت شیرك و هاوبەش دانانە بۆ **الله** ، ئینجا فەرمانی کردووە بە ئەنجامدانی نوێژ و

---

[1] گرنگە مامۆستا بایەخ بدات بەوەی کە لا الە الله هەروشەیەك نییەو بوترێت و تەاو، بەڵکو چەند مافێکی هەیە و بە کورتی و بەڕوونی بۆیان باس بکرێت وەکو لەم نامیلکەشدا باس کراوە.

[2] الزخرف: ٢٦-٢٨.

[3] البينة: ٥.

دەرکردنی زەکات، ئەمەیە زۆربەی ئاینی ئیسلام و شتەکانی تر لە شەریعەتدا پاشکۆی ئەمانەن.

بەڵگەش لەسەر ئەوەی ڕۆژوو فەرزە فەرموودەی **الله** یە لە قورئاندا: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ)[1] تاکو دەگاتە:

( شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَىٰ وَالْفُرْقَانِ ۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ)[2]

بەڵگەش لەسەر فەرز بوونی حەج فەرموودەی **الله** یە لە قورئاندا: (وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا )[3]

***

[1] البقره ١٨٣

[2] البقرة: ١٨٥.

[3] آل عمران:٩٧.

# بەشی سێیەم
# بنەماکانی بیروباوەڕ

بنەماکانی بیروباوەڕ و ئیمانیش بریتین لە شەش بنەما:

١- باوەڕ بهێنیت بە **الله**.
٢- بە مەلائیتەکان.
٣- بە کتێبەکانی.
٤- بە پەیامبەرەکانی.
٥- بە ڕۆژی دوایی.
٦- بە چاکە و خراپەی قەدەر.

بەڵگەی ئەوەش لە فەرموودەی صحیح دا هاتووە لە هەردوو صحیح ی بوخاری و موسلیم دا کە عومەری کوڕی خەتتاب **الله** لێی ڕازی بێت دەیگێڕێتەوە و دەست پێ دەکات بە: " **بَيْنَمَا نَحْنُ جُلُوسٌ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ذَاتَ يَوْمٍ، إِذْ طَلَعَ عَلَيْنَا رَجُلٌ شَدِيدُ بَيَاضِ الثِّيَابِ، شَدِيدُ سَوَادِ الشَّعْرِ.....**"

**پرسیار:** ئەگەر پێت وترا: کێ پەیامبەری تۆیە؟

**لە وەڵامدا بڵێ:** پەیامبەری ئێمە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبولموتتەلیبی کوڕی هاشیمی کوڕی عەبدو مەنافە.

**الله** تعالی ئەوی هەڵبژاردووە لە هۆزی قورەیش کە ئەو هۆزە بژاردەی نەوەی ئیسماعیل بوون و ڕەوانەی کرد بۆ هەموو سپی

پێست و ڕەش پێستێك، قورئان و حیكمەتیشی بەسەردا دابەزاند و بۆ ئەوەی خەڵكی تەنها **الله** بپەرستن و دەست بەرداری پەرستراوەكانی خۆیان بن لە بت و بەرد و دارو درەخت وپەیامبەران و پیاوچاكان و مەلائیكەت و هەر پەرستراوێكی تر.

خەڵكی بانگهێشت كرد بۆ وازهێنان لە شەریك و هاوبەش بۆ **الله** دانان و لەسەر ئەوە لە دژیان جەنگا لە پێناو ئەوەی تەنها **الله** بپەرسترێت، وەكو فەرموویەتی: (قُلْ إِنَّمَا أَدْعُو رَبِّي وَلَا أُشْرِكُ بِهِ أَحَدًا)[1]

هەروەها فەرموویەتی: (قُلِ اللَّهَ أَعْبُدُ مُخْلِصًا لَّهُ دِينِي)[2]

هەروەها فەرموویەیی: (قُلْ إِنَّمَا أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ اللَّهَ وَلَا أُشْرِكَ بِهِ ۚ إِلَيْهِ أَدْعُو وَإِلَيْهِ مَآبِ)[3]

**الله** تعالى فەرموویەتی: (قُلْ أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَأْمُرُونِّي أَعْبُدُ أَيُّهَا الْجَاهِلُونَ، وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ، بَلِ اللَّهَ فَاعْبُدْ وَكُن مِّنَ الشَّاكِرِينَ)[4]

---

[1] الجن ٢٠

[2] الزمر: ١٤.

[3] ، الرعد:٣٦

[4] الزمر: ٦٤-٦٦.

لە بنەماکانی بیروباوەڕیش کە مرۆڤ لە بێباوەڕی ڕزگار دەکات ئەوەیە : باوەڕ هێنان بە زیندوو بوونەوە و ناردن و پاداشت و لێپرسینەوە وبەهەشت و دۆزەخ هەموو ئەوانەڕاست وحەقن.

**الله** تعالی فەرموویەتی: (مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ )[1]

هەروەها فەرموویەتی: (وَإِن تَعْجَبْ فَعَجَبٌ قَوْلُهُمْ أَإِذَا كُنَّا تُرَابًا أَإِنَّا لَفِي خَلْقٍ جَدِيدٍ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ وَأُولَٰئِكَ الْأَغْلَالُ فِي أَعْنَاقِهِمْ وَأُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ)[2] **الله** تعالی لە کوفر و کردەوەکانی کوفر پارێزراومان بکات، ئەم ئایەتانە ئەوەیان ڕوون کردووەتەوە کە پەیامبەری خۆشەویستمان بەوە ڕەوانە کراوە کە عیبادەت تەنها بۆ **الله** بێت و جگە لە **الله** عیبادەت بۆ هیچ کەسێکی تر نەکرێت، ئەوەش ڕاستی دینەکەیەتی کە خەڵکی بۆ بانگهێشت دەکرد و کۆششی لەسەر بەرپاکردنی دەکرد.

**الله** تعالی لە تەمەنی چل ساڵیدا پەیامبەری ڕەوانە کرد سەڵات و سەلامی لەسەر بێت، ئەویش بۆ ماوەی دە ساڵ بانگی خەڵکی بۆ تەنها پەرستنی **الله** کرد و ئینجا بەرز کرایەوە بۆ ئاسمان و **الله** تعالی ڕاستەوخۆ بێ ئەوەی هۆکارێك لە نێوان خۆی و پەیامبەرەکەیدا هەبێت پێنج نوێژەکەی لەسەر فەرز کرد.

---

[1] طه: ٥٥.

[2] الرعد:٥.

دوای ئەوە فەرمانی کۆچ کردنی بۆ مەدینە پێکرا و فەرمانی پێکرا جیهادی بێباوەڕانیش بکات، ئەویش دە ساڵ ئەو فەرمانەی جێبەجێ کرد تاکو خەڵکی پۆل پۆل دەهاتنە دینی ئیسلامەوە، کاتێك تەمەنی گەیشتە شەست و سێ ساڵ - سوپاس بۆ الله - دینی ئیسلام بە تەواوی ڕاگەیەندرا و فەرمانی الله تعالی لە وەفاتی پەیامبەرەکەی هاتە جێبەجێکردن، صلی الله علیه و سلم. یەکەمین پەیامبەری ڕەوانە کراو نوح بوو علیه السلام، کۆتاییشیان موحوممەد بوو صلی الله علیه وسلم، وەکو الله تعالی فەرموویەتی: (إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَىٰ نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِن بَعْدِهِ)[1]

هەروەها فەرموویەتی: (وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ )[2]

هەروەها فەرموویەتی: (مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِنْ رِجَالِكُمْ وَلَكِنْ رَسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا)[3]

چاکترین پەیامبەر پەیامبەری ئێمەیە صلی الله علیه وسلم، چاکترین ئادەمیزادەکانیش لە دوای پەیامبەران:

١- ئەبو أبو بکر الصدیق.
٢- عمر بن الخطاب.
٣- عثمان بن عفان.
٤- علي بن أبي طالب.[1]

---

[1] النساء:١٦٣
[2] ال عمران: ١٤٤.
[3] الاحزاب:٤٠.

الله لە هەموویان ڕازی بێت. چاکترین سەدەکانیش ئەو سەدەیە کە پەیامبەری تێدا ژیاوە صلی الله علیە و سلم، ئینجا سەدەی دوای ئەوەو سەدەی دواتری ئەو سەدە. پێش هاتنی قیامەتیش عیسا یش علیە السلام لە ئاسمان دادەبەزێت و دەجال دەکوژێت.

***

[1] گرنگە کورتەیەك لە ژیانی ئەو چوارهاوەڵە بەڕێزە بۆ مناڵان باس بکرێت و خۆشەویستنی ئەوان و هاوەڵانی تر لەلایان ببەسترێتە دین و ئیمانەوە.

## بەشی چوارەم
## لا إله إلا الله و مەرجەکانی

**پرسیار:** پلەو پایەو گرنگی شایەتمان واتە: وتنی أشهد ان لا إله إلا الله و أشهد ان محمدا رسول الله لە ئایینی ئیسلامدا چییە؟

**وەڵام:** بەندە ناچێتە ئیسلامەوەو پێی ناوترێت موسوڵمان بەو دوو شایەتییە نەبێت.

**پرسیار:** لا إله إلا الله واتای چی دەگەیەنێت؟

**وەڵام:** واتای ئەوە دەگەیەنێت هیچ پەرستراوێك بە حەق نییە جگە لە **الله** نەبێت.

**پرسیار:** مەبەست لە ( لا إله) چییە؟

**وەڵام:** مەبەست ئەوەیە نکۆڵی بکرێت لە هەموو پەرستراوێك بە هەر شێوەیەك لە شێوەکان جگە لە الله نەبێت.

**پرسیار:** مەبەست لە ( إلا الله) چییە؟

**وەڵام:** مەبەست ئەوەیە عیبادەت تەنها بۆ **الله** جێگیر بکرێت.

**پرسیار:** ئایا تەنها بە وتنی (لا إله الا الله) موسوڵمان دەچێتە بەهەشتەوە، یان مەرجی خۆی هەیە دەبێت موسوڵمان جێبەجێی بکات؟

**وەڵام:** (لا إله الا الله) هەشت مەرجی هەیە بۆ ئەوەی لەلای الله وەرگیراو بێت و خاوەنەکەی بە هۆیەوە بچێتە بەهەشتەوە:

١- **العلم**: واتە بزانێت چی دەڵێت و هەر وشەیەك نەبێت لەسەر زاری بێت و نەزانێت واتای چی دەگەیەنێت.

٢- **اليقين**: واتە بە دڵنیایی و بێ هیچ گومانێك بیڵێت.

٣- **الاخلاص**: بەدڵسۆزییەوە بیڵێت و مەبەستی پێی تەنها **الله** بێت.

٤- **الصدق**: واتە راستگۆ بێت لە وتنیدا.

٥- **المحبة**: واتە بە خۆشحاڵی و بە خۆشەویستییەوە بۆ **الله** و پەیامبەرەکەی بیڵێت و ئەو خۆشەویستییەش بە شوێنکەوتن و گوێڕایەڵی بسەلمێنێت.

٦- **الانقياد**: واتە ملکەچ و پابەند بێت بۆ فەرمانەکانی قورئان و سوننەت.

٧- **القبول**: واتە بە کردار و بە گوفتار پێی ڕازی بێت و وەریگرێت.

٨- **الكفربما يعبد من دون الله**: واتە نکۆڵی بکات لە هەموو پەرستراوێك جگە لە **الله** و ڕەتیان بکاتەوەو حاشایان لێ بکات.

**پرسیار**: **(محمد رسول الله)** مەعنای چییە؟

وەڵام: مەعنای ئەوەیە گوێڕایەڵی بکەیت لە هەموو ئەوەی فەرمانی پێکردووین و باوەڕی پێ بهێنیت لە هەموو ئەوەی ئێمەی ئاگەدار کردووەتەوە و هەواڵی پێداوین و لە هەموو ئەوەی لێی

قەدەغە کردووین خۆمان بپارێزین و **الله** ش نەپەرستین بە ڕێگەیەك نەبێت کە خۆی پێی ڕازییە.

**پرسیار**: ئیمان چی واتایەك دەگەیەنێت؟

وەڵام: وتنە بە زمان، باوەڕە بە دڵ، کردارە بە ئەندامەکانی جەستە.

**پرسیار**: ئایا ئیمان زیاد و کەم دەکات یان هەمیشە جێگیرە؟

وەڵام: بەڵێ زیاد و کەم دەکات.

**پرسیار**: بەچی زیاد دەکات و بە چی کەم دەکات؟

**وەڵام**: بە گوێڕایەڵی **الله** و پابەند بوون بە فەرمان و قەدەغەکراوەکانی لە قورئان و سوننەتدا زیاد دەکات.

**پرسیار**: ئەی بەچی کەم دەکات؟

**وەڵام**: بە گوێڕایەڵی کردنی شەیتان و سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی **الله** کەم دەکات.

**پرسیار**: ئیمان چەند بەشی هەیە؟

**وەڵام**: ئیمان زیاتر لە حەفتا بەشی هەیە، بەرزترینیان **(لا إله الا الله)** یە و، نزمترینیان ئەوەیە شتێك لەسەر ڕێگە لابدەیت مایەی ئازار بێت بۆ خەڵکی، شەرمیش بەشێکە لە بەشەکانی ئیمان.

**پرسیار**: پلەو پایەی **( الاحسان)** لە ئایینی ئیسلامدا واتای چییە؟

**وەڵام**: **(إحسان)** واتە: **الله** بپەرستیت وەکو ئەوەی بیبینیت، چونکە ئەگەر تۆ ئەو نابینیت ئەو تۆ ئەبینێت.

**پرسیار**: بەرزترین پلەو پایەکانی دین کامانەن؟
وەڵام: بەرزترین پلەو پایاەکانی دین پلەو پایەی **( الاحسان)** ە و ئینجا پلەو پایەی **(الإيمان)** و ئینجا پلەو پایەی **( الإسلام)**.
هەموو چاکەیەك لە شوێنکەوتنی پێشینانی ئەم ئوممەتەدایە و هەموو خراپەیەکیش لە داهێنانی پاشینانی ئەم ئوممەتەدایە لە دینەکەیاندا کە بەڵگەی قورئان و سوننەتی لەسەر نەبێت.

***

# بەشی پێنجەم
# جۆرەکانی تەوحید و چەند پێناسەیەکی گرنگ

**پرسیار:** تەوحید مەعنای چییە؟

**وەڵام:** تەوحید واتە پێویستە هەرچی مافەکانی **الله** هەیە لەسەرت بیدەیت.

**پرسیار:** تەوحید چەند جۆری هەیە؟

**وەڵام:** تەوحید سێ جۆری هەیە.

**پرسیار:** ئەو جۆرانە چین؟

١- توحيد الربوبية.
٢- توحيد الألوهية.
٣- توحيد الأسماء والصفات.

**پرسیار:** تەوحیدی (الربوبية) مەعنای چییە؟

**وەڵام:** واتە: تەوحیدی **الله** بکەیت و باوەڕت وا بێت کە ئەو بە تاك و تەنها توانای درووستکردن و ڕۆزیدان و ژیاندن و مراندنی هەیە.

**پرسیار:** تەوحیدی (الألوهية) مەعنای چییە؟

**وەڵام:** واتە: عیبادەت و نوێژ و ڕۆژو و و پاڕانەوە وهەر جۆرە عیبادەتێك تەنها و تەنها بۆ **الله** بکرێت.

**پرسیار:** تەوحیدی الاسماء والصفات مەعنای چییە؟

**وەڵام**: واتە: ناو و سیفەتەکانی **الله** هەمووی بۆ جێگیر بکەیت بەو شێوەی کە شایستەیەتی و لە قورئان و لە سوننەتدا ڕوون کراوەتەوە.

**پرسیار**: دوو ناو لە ناوەکانی **الله** باس بکە؟

**وەڵام**: الرحمن، الرحيم.

**پرسیار**: **الله** تعالى لە کوێیە؟

**وەڵام**: **الله** تعالى لە ئاسمانە.

**پرسیار**: بە چی **الله** تعالى دەناسیت؟

**وەڵام**: بە نیشانەو بە درووستکراوەکانی، وەکو شەو ڕۆژ و خۆر و مانگ و ئاسمان و زەوی و ئەوەش کە لە نێوانیاندا هەیە.

**پرسیار**: پێناسەی عیبادەت بکە؟

**وەڵام**: عیبادەت وشەیەکی کۆکەرەوەیە بۆ هەموو ئەوەی **الله** پێی خۆشە و پێی ڕازی دەبێت لە گوفتار و کرداری دیار و شاراوە.

**پرسیار**: عیبادەت چەند مەرجی هەیە و ئەو مەرجانە چین؟

**وەڵام**: عیبادەت دوو مەرجی هەیە:

**یەکەم**: تەنها بۆ **الله** بێت و هیچ مەبەستێکی تری تێکەڵ نەبێت.

**دووەم**: شوێنکەوتنی پەیامبەر صلى **الله** عليه و سلم ی تێدا ڕەچاو بکرێت.

**پرسیار**: چەند جۆرێکی عیبادەت باس بکە؟

**وەڵام**: نوێژ، زەکات، ڕۆژوو، حەج، چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوك، پاڕانەوە ترس و خۆشەویستی بۆ **الله** و زۆر شتی تر.

**پرسیار:** ئەگەر کەسێك عیبادەتێك لە عیبادەتەکان بۆ غەیری **الله** ئەنجام بدات، حوکمی چییە لە ئیسلامدا ؟

**وەڵام:** حوکمی ئەوەیە پەیوەندی بە ئاینی ئیسلامەوە نامێنیت و لە دین دەردەچێت، با نوێژوو رۆژوویش ئەنجام بدات و بڵێت من موسوڵمانم. **پرسیار:** پێچەوانەی تەوحید چییە؟

**وەڵام:** پێچەوانەی تەوحید شیرك و هاوبەش بۆ **الله** دانانە.

**پرسیار:** شیرك واتای چییە؟

**وەڵام:** وا بزانیت **الله** هاوتاو هاوشێوەیەکی هەیە لە هەر مافێك لە مافەکانیدا.

**پرسیار:** جۆرەکانی شیرك چین؟

**وەڵام:** جۆرەکانی شیرك دوانن.

**یەکەم:** شیرکی گەورە کە خاوەنەکەی لە دینی ئیسلام دەردەکات.

**دووەم:** شیرکی بچووك: کە خاوەنەکەی لە دینی ئیسلام دەرناچێت.

**پرسیار:** نموونەیەك لە شیرکی گەورە باس بکە؟

**وەڵام:** نەزر کردن و سەربڕین و قوربانی کردن بۆ غەیری **الله**.

**پرسیار:** نموونەیەك بۆ شیرکی بچووك باس بکە؟

**وەڵام:** سوێندخوارن بە غەیری **الله** ، ڕوپامایی و ڕیپایی کردن.

**پرسیار:** طاغوت مەعنای چییە؟

**وەڵام:** طاغوت بریتییە لەوەی بەندە لە ئاستی خۆی دەریبکات و بەرزی بکاتەوە لە هەر پەرستراوو شوێنکەوتوو گوێڕایەڵی بۆ کراوێك.

**پرسیار:** ژمارەی تاغوتەکان چەندن و سەرانیان چەندن:

١- ئیبلیسی نەفرەت لێکراو.

٢- کەسێك بپەرسترێت و خۆی بەوە ڕازی بێت.

٣- کەسێك بانگهێشتی خەڵکی بکات بۆ ئەوەی بیپەرستن.

٤- کەسێك بانگەشەی ئەوە بکات کە زانستی شاراوە ( علم الغيب ) دەزانێت.

٥- کەسێك حوکم بە قورئان و سوننەت نەکات و حوکم بە سەرچاوەو یاسای تر بکات جگە لەو دوو سەرچاوە.

**پرسیار:** چین ئەو بنەمایانەی پێویستە موسوڵمان پەیڕەوییان لێ بکات و بیانزانێت؟

**وەڵام:** پێویستە بەندەکان پەروەردگار و دین و پەیامبەری خۆیان بە باشی بناسن.

## بەشی شەشەم

## چەند زانیارییەکی گرنگ دەربارەی عەقیدەی ئیسلام

**پرسیار**: پێویستە موسوڵمان عەقیدەو بیروباوەڕی لە کوێوە وەربگرێت؟

**وەڵام**: پێویستە تەنها لە قورئان و لە سوننەتی ڕاست و درووستی پەیامبەری ئیسلام صلى الله عليه وسلم وەریبگرێت، وەکو الله تعالى فەرموویەتی: (وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ، إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ)[١] هەروەها پێویستە ئەوەش بە تێگەیشتنی هاوەڵان و پێشینانی چاکی ئەم ئوممەتە بێت.

**پرسیار**: کام کۆمەڵ لە ڕۆژی قیامەتدا ڕزگاریان دەبێت و سەرفراز دەبن؟

**وەڵام**: ڕەسول الله (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (وتفترق أمتي على ثلاث وسبعين ملة كلهم في النار إلا ملة واحدة. قالوا: ومن هي يا رسول الله ؟ قال: ما أنا عليه وأصحابي)[٢]. واتە: ئوممەتی من دەبنە حەفتا و سێ بەشەوە، هەموویان لە دۆزەخدان یەك کۆمەڵیان نەبێت، وتیان: ئەو کۆمەڵە کێن ئەی ڕەسول؟ فەرمووی: ئەوانەن کە لەسەر ڕێگەو ڕێبازی من و هاوەڵانی منن.

---

[١] النجم: ٤.

[٢] أحمد والترمذي.

حەق ئەوەیە کە پەیامبەری ئیسلام و هاوەڵان لەسەری بوونە، تۆیش ئەگەر دەتەوێت ڕزگارت ببێت و کردەوەکانت لە لای **الله** وەرگیراو بن، پێویستە شوێنکەوتووی ئەوان بیت و خۆت لە بیدعەو داهێنان لە دیندا بە دوور بگریت.

**پرسیار**: ئایا **الله** لە گەڵماندایە؟

**وەڵام**: بەڵێ لە گەڵماندایە بە زانستی بە بیستنی بە بینینی بە پاراستنی و بە ویست و توانای، ﴿ **الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى** ﴾[1]

**پرسیار**: ئایا **الله** بە چاو ئەبینرێت؟

**وەڵام**: زانایانی ئیسلام یەکدەنگن لەسەر ئەوەی **الله** لە دونیادا نابینرێ، بەڵام موسوڵمانان پەروەردگاریان لە حەشرگەو لە بەهەشتدا دەبینن،

**الله تعالى** فەرموویەتی: ﴿ **وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ * إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ** ﴾[2].

**پرسیار**: پێناسەی قورئان چییە؟

**وەڵام**: فەرموودەی **الله** یە کە خوێندنەوەی عیبادەتە ولەلای **الله** وە هاتووەو بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە، جیبریل علیە السلام لێی بیستووە و بە پەیامبەری گەیاندووە (صلى **الله** علیە و سلم) و هەموو کتێبە ئاسمانییەکانیش کەلامی **الله** یە.

---

[1] طه: ٥

[2] القيامة: ٢٢ - ٢٣

**پرسیار**: ئایا دەکرێت کار بەقورئان بکەین و دەستبەرداری سوننەتی ڕەسول **الله** بین (صلى **الله** عليه وسلم)؟

**وەڵام**: نەخێر بە هیچ شێوەیەك نابێت دەستبەرداری سوننەت بین و **الله** تعالى خۆی فەرمانی بە کارکردن بە سوننەت و وەرگرتنی سوننەت کردووە:﴿ وَمَا آَتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا ﴾[1]

سوننەتیش ڕوونکردنەوەو تەفسیرە بۆ قورئانی پیرۆز، لە فەرموودەشدا هاتووە: (ألا إني أوتيت الكتاب ومثله معه ألا يوشك رجل شبعان متكئ على أريكته يقول: عليكم بهذا القرآن فما وجدتم فيه من حلال فأحلوه وما وجدتم فيه من حرام فحرموه)[2].

**پرسیار**: ئەگەر ناکۆکی کەوتە نێوانمانەوە لەسەر مەسەلەیەك بۆ چارەسەر کردنی بۆ چی سەرچاوەیەك بگەڕێینەوە ؟

**وەڵام**: بۆ قورئان و بۆ سوننەتی ڕاست و درووست دەگەڕێینەوە، **الله** تعالى فەرموویەتی: ﴿ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ ﴾[3] واتە: ئەگەر ناکۆکی لەسەر شتێك کەوتە نێوانتانەوە بۆ چارەسەرکردنی بۆ لای **الله** و ڕەسول بگەڕێنەوە.

---

[1] الحشر: ٧

[2] أحمد وأبو داود

[3] النساء: ٥٩

هـەروەها پەیامبـەری ئیسـلام فەرموویـەتی:(ترکت فـیکم أمـرین لـن تضـلوا مـا تمسـکتم بهمـا: کتـاب الله وسـنة نبیـه".[1]) واتـە: لـە دوای خـۆم دوو شـتم بـۆ بـە جێ هێشـتوون ئەگـەر دەسـتیان پێـوە بگـرن هـەرگیز گـومڕا نـابن: کتێبی **الله** و سـوننەتی پەیامبەرەکـەی (صلی **الله** علیه وسلم).

**پرسیار**: مەزنترین و گەورەترین تاوان لە لای **الله** چییە؟

**وەڵام**: شـەریك بـۆ **الله** بڕیاردانـە وەکـو خـۆی فەرموویـەتی: ﴿ إِنَّ الشِّـرْكَ لَظُلْـمٌ عَظِـيمٌ ﴾[2]. واتـە: هاوبـەش بـۆ **الله** دانـان سـتەمێکی هەرە گەورەیە.

**پرسیار**: حوکمی ڕۆیشتن بۆ لای فاڵچی و کتێبگرەوە چییە؟

**وەڵام**: ئـەوە کـارێکی قەدەغـەکراوەو حەرامـە، ئەگـەر کەسـێك بچێتـە لایـان بـا بـاوەڕیش بـە قسـەکانیان نـەکات، چـل ڕۆژ نـوێژی وەرناگیرێت، وەکو لە فەرموودەی صحیح دا هاتووە: (من أتی عرافا فسـأله عـن شيء لـم تقبـل لـه صـلاة أربعین لیلـة)[3]. واتـە: کەسێك بچێتـە لای فاڵچییـەك و پرسـیاری شـتێکی لێ بکـات چـل شـەو نـوێژی لێ وەرناگیردرێت.

**پرسیار**: ئایا درووستە جگە لە کەعبە بەدەوری هیچ بینا و گۆڕ یان هەر شتێکی تردا بسوڕێینەوە؟

---

[1] امام احمد

[2] لقمان: ١٣

[3] رواه مسلم

**وەڵام**: لە سەر زەویدا جگە لە کەعبە هیچ جێگەیەکی تر نییە کە درووست بێت تەواف و سوڕانەوە بە دەوریدا ئەنجام بدرێت.

الله تعالى فەرموویەتی: ﴿ وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ ﴾[1]. واتە: بەدەوری ماڵی دێرین و بەنرخی خوا (کەعبە)دا، با (طواف) بکەن.

**پرسیار**: کلیلی بەهەشت بریتییە لە چی؟

**وەڵام**: ( لا إله إلا الله) کلیلی بەهەشتە، هاوەڵی بەڕێز ئەبوموسای ئەشعەری دەفەرموێت: لە گەڵ هەندێك لە خزمانمدا چووینە لای پەیامبەر (صلى الله عليه و سلم) ئەویش فەرمووی: (أبشروا وبشروا من وراءكم إنه من شهد أن لا إله إلا الله صادقًا بها دخل الجنة)[2]. واتە: موژدەتان لێ بێت و موژدەش بەوانە بدەن کە لەگەڵتاندا نەهاتوون، کە هەر کەسێك بە ڕاستەوە بڵێ: ( لا إله إلا الله) دەچێتە بەهەشتەوە. بۆیە پێویستە سوور بیت لەسەر جێبەجێ کردنی مەرجەکانی (لا إله الا الله) و لە هەموو شیرك و گومانێك پاراوی بکەیتەوە، یان لە هەر عیبادەتێکی دڵ و ئەندامەکان کە لەگەل (لا إله الا الله ) ناکۆك بێت و تێك بگیرێت، چونکە ئەوە ڕێگای چوونە بەهەشتە بۆ موسوڵمان. جێبەجێ کردنی (لا إله الا الله) بە تەنها وتنی ئەو وشە نییە بە زمان، بەڵکو پێویستە بە گوفتار و بە باوەڕهێنان و بە کردار بیسەلمێنێت.

---

[1] الحج: ٢٩

[2] صحيح مسند الإمام أحمد ٤ /٢١١

# بەشی حەوتەم
# چەند ڕێگەو شێوازێك بۆ فێركردنی تەوحید بۆ مناڵان

دەكرێت بە چەندین ڕێگە بیروباوەڕی تەوحید وبنەماكانی ئیمان فێری منداڵان بكەین، ئەمەی خوارەوە چەند ڕێگەیەكە كە هەندێ لە توێژەرانی ئەو بوارە دیارییان كردووە.وەكو :

**یەكەم**: شێوازی پرسیارو وەڵام: ئەم شێوازە خودی پێغەمبەر (صلى **الله** عليه وسلم) بە كارهیناوە، بۆ نموونە: پرسیاری ئەكرد: اين **الله** ؟ واتە: **الله** لە كوێیە؟ پرسیارەكانیش بە شێوەیەك دەبێت بكرێت وەڵامەكەی كورت بێت، وەكو ئەم پرسیارەی سەرەوە بۆ نموونە: **الله** لە كوێیە؟ **الله** لە ئاسمانە.

**دووەم**: ناساندنی **الله** بە منداڵان، بۆ ئەوەی خۆشیان بوێت و بیپەرستن و لێی بترسن، چونكە ئەگەر كەسێك نەناسیت ناتوانیت پلەو پایەی شایستەی خۆی بدەیتێ، یەكێكیش لە ڕێگەكانی ئەو ناساندنە ئاسان كردن و پوخت كردنەوەی ناوو سیفەتەكانی **الله** یە بە شێوازی هەمەرەنگ و جیا جیا.

**سێیەم**: ناساندنی ڕسول **الله** (صلى **الله** عليه وسلم) بە شێوەیەكی سووك و ئاسان و دڵگیر بۆ منداڵان بۆ ئەوەی خۆشیان بوێت و گوێڕایەڵی بكەن، لەو بارەشەوە دەكرێت باسی قۆناغی منداڵی پەیامبەر بكەین (صلى **الله** عليه وسلم) و هەڵوێستی لە

منداڵان و پێکەنین و گاڵتەکردنی لەگەڵ ئەوان و هەروەها باسی ڕەوشتە جوانەکانی بکەین.

**چوارەم**: تەفسیرێکی پوخت و جوانی ئەو سورەتانەیان بۆ بکەین کە باسی عەقیدە و بیروباوەڕی لە خۆ گرتووە، وەکو تەفسیری سورەتەکانی: (**الفاتحة ، الإخلاص ، الفلق ، الناس**) . هەروەها هەندێ فەرموودەی پەیوەندیدار بە عەقیدەوە بۆ شەرح ئەکەین بە شێوەیەکی ئاسان و بە شێوازێکی جوان.

**پێنجەم**: لە ڕێگەی ڕەنگ کردنی وێنەو پڕکردنەوەی هەندێ نیگار و نەخشە کە واتای عەقیدەو تەوحیدی لە خۆ گرتبێت.

**شەشەم**: لەبەرکردنی هەندێ هۆنراوەی عەقیدەو جەختکردنەوە لە سەر تەوحید و بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت ، وەکو: هۆنراوەکەی (ابن تيمية) کە ناسراوە بە (**لامية ابن تيمية**) یان ( سلم الوصل الى علم الأصول) و شەرح کردنی بۆیان بە شێوازێکی زۆر ئاسان و دڵگیر.

**حەوتەم**: گرێدانی هەندێ هەڵوێست و ڕووداو لە ژیانی منداڵاندا بە عەقیدە بیروباوەڕەوە، بۆ نموونە:

- لە کاتی نەخۆشکەوتنیدا فێری ئەوەی ئەکەین دڵی بە پەروەردگارییەوە ببەستێت و لێی بپاڕێتەوەو گومانی باشی پێی هەبێت و روقیە بکات.
- لە کاتی دەرکەوتنی مانگی چواردە بە جوانی لە ئاسماندا، جەریری کوری عەبدوڵای بەجەلی دەفەرموێت، لەلای پەیامبەر

بووین كاتێك مانگی بینی و فەرمووی ئێوە چۆن ئەو مانگە دەبینن بەو شێوە پەروەردگارتان دەبینن.. ( إنكم سترون ربكم كما ترون هذا القمر لا تضامون في رؤيته)[1].

**هەشتەم**: لە ڕێگەی پەروەردە كردنیان لەسەر خۆشەویستی هاوەڵان الله لێیان ڕازی بێت، وەكو مالیكی كوری ئەنەس دەیفەرموو: ( كان السلف يعلمون أولادهم حب أبي بكر وعمر كما يعلمونهم السورة من القرآن)[2]. واتە: پێشینانی چاك خۆشەویستی ئەبو بەكر و عومەریان فێری منالەكانیان دەكرد وەكو چۆن سورەتێكی قورئانیان فێر ئەكردن.

**نۆیەم**: منداڵان فێر بكرێن لە كاتی هاتنی نیعمەتێك لەلای پەروەردگارەوە یان ڕزگار بوونیان لە ناخۆشی و ئازارێك سەجدەی سوپاسگوزاری بۆ الله ببەن، بۆ ئەوەی دڵیان بە خاوەنی ڕاستەقینەی ئەو نیعمەتە ببەستینەوە.

**دەیەم**: ناساندنی دایكانی ئیمانداران و ئالوبەیتی پەیامبەر (صلى الله عليه وسلم) بە منالەكانمان بە ڕێگەی گونجاو بۆ ئەوەی ڕێزو خۆشەویستی ئەوانیان لەلا درووست بكەین لەو تەمەنەوە.

**یانزەیەم**: هەندێ وشەو دەربڕین و دەستەواژە لەبەردەم منداڵەكانماندا بە مەبەست وئەنقەست دووبارە بكەینەوە، بۆ ئەوەی ئەوانیش لە ژیانیاندا بە كاریبهێنن، وەكو:

---

[1] رواه البخاري كتاب مواقيت الصلاة » باب فضل صلاة العصر.

[2] (تاريخ دمشق ٣٨٣/٤٤).

(قدر **الله** وما شاء فعل/ توكل على **الله** : پشت بە **الله** ببەستە / لا إله إلا **الله** / **الله** يراك : **الله** دەتتبینێت/ **الله** قدير: **الله** بەتوانايە/ **الله** كريم سبحانە: **الله** بەخشندەيە.. یان هەر قسەو دەستەواژەیەکی تر کە واتا ئیمانی و عەقیدەییەکان لە دڵی منالاّندا بچەسپێنێت. هەروها دەکرێت لە ڕێگەی سازکردنی پێشبڕکێ و هەندێ بەرنامەی ئەلیکترۆنی و درووستکردنی نمایشی پاوەرپۆینت و درووستکردنی فلاش..هتد

یان ئاراستە کردنی منالّ بۆ ڕازاندنەوەی ژوورەکەی بە هەندێ تابلۆ کە واتای جوان و ڕیك و پێکی بیروباوەر و تەوحیدی لەسەر نووسرابێت.

***

## بەشی هەشتەم
## هۆنراوەیەك بۆ فێربوون و فێرکردنی عەقیدە

ئەمە هۆنراوەیەکی پڕ واتاو جوانە و زۆرێکی لەو بنەمایانەی پێشتر باسمان کرد تێدایە بە شێوەی هەڵبەست، کارێکی باشە ئەگەر بۆ منداڵان شەرح بکرێت و پێیشیان لەبەر بکرێت، لە لایەکەوە واتاکانی تەوحید و بیروباوەڕی ڕاستیان پێ دەگەیەنێت و، لە لایەکی تریشەوە هۆکارێکە بۆ فێربوونی زمانی عەرەبی ئەگەر واتای وشەکانیان بۆ وەرگێڕینە سەر زمانی کوردی بە وردی، هۆنراوەکە بریتییە لە سی و چوار دێڕ و سەرتا بە سوپاس و ستایشی الله دەستی پێکردووە و بەوەش کۆتایی پهێناوە

الحمدُ للهِ عظيمِ الشــــانِ
بكل نعمـةٍ هــو ربانـــي

**سوپاس و ستایش بۆ الله ی مەزن لە هەموو کاروبارێکیدا**
**کە ئەو زاتەمنی بە هەموونیعمەتێك پەروەردە کردووە**

ثم الصـلاةُ والسـلامُ أبــدا
على النبيِّ الهاشميِّ أحمـــدا

**ئینجا سەڵات و سەلامی هەمیشەیی نەبراوە،**
**لەسەر پەیامبەری هاشیمی ئەحمەد بێت.**

فـهـذه منظومـةٌ مفيـــدة
لينشئ الأطفـال بالعـقــيـدة

**پاشان ئەمە هۆنراوەیەکی بە سوودە،**
**بۆ ئەوەی منالان لەسەر عەقیدە پەروەردە بکرێن.**

**كي يحفظوا العلومَ حالَ الصغرِ**
**فإنه كالنقـشِ فـوقَ الحـجـرِ**
**بۆ ئەوەی زانستەکان لە کاتی منداڵید لەبەر بکەن،**
**چونکە فێربوونی زانست لە کاتی منداڵیدا وەکو نەخشی سەر بەرد وایە لاناچێت.**

**أرجو لها القبـولَ بين النـاسِ**
**تكـونُ في التوحـيدِ كالأسـاسِ**
**تکا ئەکەم لە پەروەرگارم پەسەند کراوی بکات لەلای خەڵکی،**
**بۆ ئەوەی لە تەوحیددا ببێتە بنچینەو بناغەیەکی باش.**

**فمصدرُ العقيـدةِ الصحيحــة**
**الآيُ والرسـولُ خـذ نصيحـة**
**سەرچاوەی عەقیدەی راست ودرووست بریتییە لە ئایەتەکان و ئەوەی پەیامبەری ئیسلام فەرموویەتی صلی اللە علیە و سلم،**
**ئەمە ئامۆژگاری منە بۆ تۆ وەری بگرە.**

**بفهمِ أصحابِ القرونِ الأولــى**
**مَنْ حـادَ عن أقوالهم مخـذولا**
**بە تێگەیشتنی سێ سەدە باشەکان و هەرکێیش لە تێگەیشتنی ئەوان لابدات شکست خواردووە.**

**وأول السؤال عـن مَـنْ ربـي**
**فهو الإلـهُ الحـقُ دون ريْـبِ**

**یەکەمین پرسیاریش ئەوەیە کێ پەروەردگارمە،**
**کە ئەویش الله ی ڕاستەقینەو حەقە یەبەبێ هیچ گومانێك.**

عرفتُه بالخلقِ والآياتِ
قد استوى في عرشه بالذات

**بە درووستکراوەکانی و بە بەڵگەو ئایەتەکانی ئەوم ناسی،**
**بە زاتی خۆی لەسەر عەرشەکەی (استواء) ی کردووە.**

وأمرُه العظيمُ بالتوحيدِ
نهى عن الإشراك والتنديدِ

**فەرمانی هەرە مەزنیشی بۆ ئێمە ئەوەیە لەسەر تەوحید بین، هاوەڵ و هاوشێوە دانانیشی لەسەر قەدەغە کردووین بۆ خۆی.**

والشركُ نوعانِ هما الأكبرُ
ودونه -فيما علمنا الأصغرُ

**شیرك و هاوەڵدانانیش بۆ الله دوو جۆرە، شیرکی گەورەو لەوەش خوارتر شیرکی بچووکە بەو زانستەی کە فێری بوونە.**

له فقط أن تُصرَفَ العبادة
من دونَ نقصانٍ ولا زيادة

**عیبادەت تەنها و تەنها بەبێ زیاد و کەم بۆ خۆی - بۆ الله - ئەنجام ئەدەرێت.**

منها الصلاةُ والصيامُ والدعا
فاحفظْ فخيرُ طالبٍ مَنْ قد وعى

**بۆ نموونە نوێژ و ڕۆژوو و پاڕانەوە،**
**ئەمە لەبەر بکە چاکترین فێرخوازە ئەو کەسەیە باش تێدگات و زانست وەردەگرێت.**

شروطُها الإخـلاصُ والمتابعـة
حـتى تكـونَ يا بُنـيَّ نافعــة
مەرجەکانیشی پێویستە (إخلاص)ی تێدا بێت واتە لە هەموو
کردەوەیەك مەبەست تەنها بۆ الله بێت  و شوێنکەوتنی پەیامبەر صلی
الله علیه و سلم بۆ ئەوەی عیبادەتێکی بە سوود بێت ڕۆڵەکەم.

إسـلامُ والإيمانُ والإحســانُ
أصـولُ هـذا الدينِ والأركــانُ
ئیسلام و ئیمان و ئیحسان بنچینەو کۆڵەکەکانی ئەم دینەن.

كـلٌّ لـه بـشرعـنا تفصــيلُ
بـذا أتـى معـلِّــماً جـبريـلُ
هەموو یەکێکیش لەوانە شیکردنەوەو وردەکاری تێدایە و جیبرل
سەلامی الله ی لێبێت وردەکاری ئەو زانستەی پێ گەیاندووین.

يجـيبـه النبيُّ وهـو يســألُ
عن هـذه الأركــانِ فيما نقـلوا
ئەو پرسیاری دەکرد دەربارەی ئەو کۆڵەکانە و پەیامبەرمان صلی الله
علیه و سلم وەڵامی ئەدایەوە  وەکو پێمان گەیشتووە لە فەرموودەکاندا.

وواجـبٌ إيمانُـنا بالرســـلِ
لأنهم أهــلٌ لـذاك الفضـــلِ
پێویستیشە باوەڕمان بە پەیامبەرران هەبێت، چونکە ئەوان
شایستەی ئەو فەزڵ و چاکەیەن.

يدعون للتوحيـدِ والإيمـــانِ
والكفرِ بالأصنــامِ والأوثــانِ

**ئەوان بانگەوازیان بۆ تەوحید و ئیمان دەکرد**
**هەروەها بانگەوازیان بۆ کوفر کردن بە بت و بەردە داتاشراوەکان دەکرد.**

أعدادُهــم كثـيرةٌ لكنــنا
نؤمنُ بالتفصـيلِ فيمَـنْ عنـدنا
**پەیامبەران ژمارەیان زۆرن،**
**بەڵام ئێمە بە شێوەیەکی گشتی باوەڕمان بە هەموویان هەیە.**

عشرون بعد خمسة قـد وردت
أسماؤهـم معلومـةٌ اشتهــرت
**ناوی بیست و پێنج لەو پەیامبەرانە ناوبانگیان هەیە و زانراون.**

الأولُ المنصـورُ بالطوفــانِ
والخـاتمُ البشيـرُ مـن عدنـانِ
**یەکەمیانە نوح ه علیه السلام کە بە تۆفان لافاوەکە پشتگیری لێ کرا،**
**دواپینیشیان ئەو پەیامبەرەیە کە لە بژاردەی هۆزی عەدنانە.**

نـبيُنا المبعــوثُ للأنــامِ
جميعهم بديــنِه الإســلامِ
**پەیامبەرمان کە بۆ هەموو خەڵکی بە دینی ئیسلام ڕەوانە کراوە .**

فـلا رسـولَ بعـده ولا نبــي
لأنـه الأخيـرُ منهـم يا صبــي
**نە ڕەسول و نە نەبی بەدوایدا ئیتر نایەت، چونکە ئەو خاتەم و کۆتایی پەیامبەرانە ئەی کوڕی تازەپێگەیشتوو.**

أخـلاقُـه عظـيمـةٌ مزدانــة
كالصـدقِ والعـدلِ مع الأمانــة
ڕەوشت و ئاکارەکانی مەزن و جوان بوو، وەکو ئاکاری ڕاستگۆیی و دادگەری و ئەمانەت پارێزی.

واجبُـنا تجاهــهُ محبتُــه
طاعتُـه تعظيمُـه ونصـرتُــه
ئەرکی ئێمە بەرانبەری ئەو پەیامبەرە صلى الله عليه و سلم ئەوەیە خۆشمان بوێت و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بکەین و بە مەزن و گەورەی بزانین وپشتگیری بکەین.

وحـبُّ آل البيـتِ والصحابـة
لمن يريـدُ الفـوزَ والإصابــة
هەروەها خۆشویستنی ئالوبەیت و هاوەڵانی پێویستە بۆ کەسێك بیەوێت سەرفراز بێت و حەق و ڕاستی بپێکێت.

لا نرتضي عن نهجهم بديــلا
فأنهم قد شاهــدوا التـنزيـلا
ئێمە بە هیچ ڕێبازیکی تر جگە لە ڕێبازی ئەوان ڕازی نابین، چونکە ئەوان ئامادەی دابەزینی قورئان بوون.

بفهمهم يتضـحُ المنقــــولا
لأنهم قـد صَحِبــوا الرســولا
بە تێگەیشتنی ئەوان قورئان و سوننەت ڕوون دەبێتەوە، چونکە ئەوان هاوەڵێتی پەیامبەریان کردووە صلى الله عليه و سلم.

وعصرُهم أفضلُ مِن ســـواهُ
كذا أتى نصـاً بمـا معـنــاهُ

**سەردەمی ئەوانیش وەکو لە فەرمودەدا هاتووە چاکترە لە هەموو سەردەمێکی تر.**

كذاك كلُ مؤمـنٍ نوالـــي
ونبغـضُ الكفــارَ ونعـــادي

**خۆشەویستی و پشت گیری هەموو ئیماندارێکیش ئەکەین، ڕقمان لە هەموو کافرێکیشە و دژایەتی ئەکەین.**

فجنةُ الرحــمـنِ للأبـــرار
والـنارُ للكــفارِوالفجـَّــارِ

**بەهەشتی الرحمن یش بۆ چاکەکارانە و دۆزەخیش بۆ کافر و خراپەکارانە.**

فـنسـألُ اللهَ لنـا الإخـلاصَ
والفـوزَ بالجــنةَ والخـلاصَ

**داواکارین لە الله تعالی هەموو کردەوەکانمان تەنها بۆ بۆ خۆی بێت، بەهەشت و ڕزگاربوونیش لە سزا بەدەست بهێنین.**

فهـذه منظومتي قـد تمَّــت
بحمـده سبحانـه قـد خُتِـمـت

**بەم شیوەش هۆنراوەکەم بە ئەنجام گەیشت و سوپاس بۆ الله کۆتایی پی هات.**

***

# کۆتایی

لەم چەند لاپەڕەی پێشوودا، هەوڵم داوە پاڵ پشت بە قسەی زانایان و ئەوانەی لەم بوارە دانراوی تایبەتیان هەیە، ئەوەی پێویستە سەبارەت بە تەوحید و جۆرەکانی، بە شیرك و بەشەکانی، هەروەها چەندین باسی گرنگی تر لە باسەکانی بیروباوەر بە ڕوون و ئاسانی بخەمە روو، داواکارم لە لەلایەن کەسانی پەیوەندیدارەوە بایەخی پێویستی پی بدرێت، بە تابەتی لەلایەن باوکان و دایکان و مامۆستایانەوە، چونکە گرنگی عەقیدەی راست و درووست بۆ موسوڵمانان بە گشتی و منداڵان بە تایبەتی، وەکو گرنگی بناغەی تۆکمەیە بۆ باڵەخانەیەکی بەرز، چەند بناغەکەی بە هیز بێت تەلارەکە ڕاوەستاوتر دەبێت و لە هەموو مەترسییەك بە دوورتر دەبێت.

لەم نامیلکەیە هەوڵم داوە ئەوەی زانین و فێربوونی پێویستە بۆ مناڵان باسی بکەم و بێخەم ڕوو، داواکارم لەو مامۆستایانەی دەیڵێنەوە بە شێوازێکی پەسەند و ئوسلوبێکی جوان بە مناڵانی بگەیەن و من و ئەوان هەرکێیش ڕۆڵی بووە لە بڵاو کردنەوەی ئەم بابەتە - ان شاء الله - چاوەڕوانی پاداشتی الله دەبین.

داواکاریشم لە نووسەران و مامۆستایانی عەقیدە پاك کە مەبەستیانە بانگەوازی تەوحید لە کوردستاندا بڵا بکەنەوە ئەم بوارە دەوڵەمەند بکەن و تێیدا بنووسن و وانەی بە سوود و

**زانستی لەسەری  بڵاو بکەنەوە، چونکە کەلێنێکی گەورە لەم بوارە گرنگ و ترسناکەدا هەیە لە پڕنەکردنەوەی هەمووومان لە لای الله تعالی بەرپرسین.**

**والحمد لله الذي بنعمته تتم الصالحات**

**احسان برهان الدين ٠٦ / ١١ / ١٤٣٩ بەرامبەر ١٩ /٧/ ٢٠١٨**

***

## سەرچاوەکان

- تعليم التوحيد الصبيان............. الشيخ محمد بن عبد الوهاب.
- الأصول الثلاثة...................الشيخ محمد بن عبد الوهاب.
- العقيدة للطفل المسلم.
- كيف نعلم العقيدة للاطفال ...... هناء بنت عبدالعزيز.
- مقدمة رسالة................. ابن أبي زيد القيرواني.
- سؤال وجواب في التوحيد والعقيدة.
- ضرورة تعليم العقيدة للناشئة.... بندر بن محمد الرباح.
- سەرچاوەی تریش.

***

# پێڕست


| سەرە بابەت | لاپەرەکان |
|---|---|
| پێشەکی | ٥ |
| پەروەردگارت کێیە و چۆن دەیناسیتەوە؟ | ٩ |
| ئیسلام وبنەماکانی | ١٣ |
| بنەماکانی بیروباوەڕ | ١٦ |
| لا إله إلا الله و مەرجەکانی | ٢١ |
| جۆرەکانی تەوحید و چەند پێناسەیەکی.... | ٢٥ |
| چەند زانیارییەکی گرنگ دەربارەی عەقیدەی ئیسلام | ٢٩ |
| چەند ڕێگەو شێوازێك بۆ فێرکردنی تەوحید بۆ منالآن | ٣٤ |
| هۆنراوەیەك بۆ فێربوون و فێرکردنی عەقیدە | ٣٨ |
| کۆتایی | ٤٥ |
| سەرچاوەکان | ٤٧ |
| **پێڕست** | ٤٨ |

## نووسەر لە چەند دێڕێکدا:

- لەدایکبووی ساڵی ١٩٧٤ لە شاری دوزخورماتوو.

- بڕوانامەی ماستەری هەیە لە زمانی عەرەبی– بەشی ئەدەبی عەرەبی هاوچەرخ لە زانکۆی (أم درمان) لە سودان.

- مامۆستایە لە زانکۆی هەڵەبجە.

- قوتابی دوکتۆرایە لە زانکۆی سلێمانی.

- لە چەند ساڵێکی جیاواز وانەبێژ بووە لە پەیمانگای زانستە ئیسلامییەکان لە کەلار

- ئیجازەی قیرائاتی عەشرەی هەیە لە ڕێگەی الشاطبية و الدرة.

کۆمەڵێك کتێبی بە چاپ گەیشتووە لەوانە:

١- ژیاننامەی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وسلم**)لە دوو بەرگدا، (نارین) دار المعرفة / بيروت. (وەرگێڕان).

٢- لێکدانەوەی پێشەکی (إبن الجزري) ، چاپی یەکەم لە بەیروت لە ڕێگەی کتێبخانەی نارین و چاپی دووەم لە سلێمانی و چاپی سێیەم لە لایەن کتێبخانەی مەحوی لە هەولێر.

٣- زەکاتی ماڵی بازرگانی.

٤- ژیاننامەی (عبد العزيز بن عبدالله بن باز).

٥- ڕابەری ئەوانەی کە عومرە دەکەن(چاپی سێیەم) جگە لە چاپێکی تر لە (الرياض)کراوە.

٦- ڕابەری حاجیان بە وێنەوە؟

٧- نزار قباني ولوثة الفكر الحداثي في شعره / کتێبخانەی نارین چاپی بیروت. (توێژینەوە).

٨- سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدە (مجلد) پرۆژەی تیشك. (وەرگێڕان)

٩- کۆتـایی جیهـان نیشـانە گـەورەو بچووکـەکانی قیامـەت (بەوێنـە (نارین) دار المعرفة / بيروت (وەرگێڕان).
١٠- (الجـامع الصـغير)ی السـيوطي (٤) بەرگـە [بـەرگی یەکـەمی بـە هاوبەشـی لەگــەڵ وەرگێڕێکــی تــر] (٦٥٠٠) فــەرموودەی خــۆم وەرمگێڕاوە ١٦٠٠ ی فەرموودەی وەرگێڕەکەی تر وەریگێڕاوە).
١١- شانۆگەری (زاناو ستەمکار)ی یوسف القرضاوي .
١٢- الإتجاه الإسلامي في شعر وليد الأعظمي/ ماستەرنامە.
١٣- فەرهـەنگی زاراوەکـانی زانسـتی قیرائـات، کتێبخانـەی مـەحوی (وەرگێڕان).
١٤- بیانناســە..هەڵدانەوەی چەنـد لاپەڕەیەکـی نادیـار لە فیکـری کەسانی ناودار.
١٥- باوەڕ بە ڕۆژی دوایی (وەرگێڕان).
١٦- التنـاص القراني فى شـعر عمـر بهـاء الأميرى..بحـث منشـور فى مجلة جامعة حلبجة.
١٧- گرنگی زمـانی عەرەبی بـۆ تێگەیشـتنی فەرموودە..تـوێژینەوەیەکە لە گۆڤاری زانکۆی هەڵەبجە بڵاوکراوەتەوە.
١٨- سقوط الدول و الحضارات في المفهوم الاسلامي قراءة في كتاب التفسير الاسلامي للتاريخ، منشور في مجلة جامعة حلبجة..

**جگە لە چەند کتێب و توێژینەوەیەکی تر هەندێکیان چاپ کراون و هەندێکیان چاوەڕوانی چاپ کردنن.**